خەلیفەی نوێخوازو چاکساز

# عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله

نووسینی

دکتۆر علي محمد الصلابي

وەرگێڕانی

مامۆستا عمر توفیق الخطاط

چاپی یەکەم

نارین

دار المعرفة

بەیرووت

خەلیفەی نوێخوازو چاکساز

# عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله

نووسینی

د. علي محمد الصَّلاَّبي

وەرگێڕانی

ماموّستا عُمَر توفیق الخطاط

چاپی یەکەم

نارین

دار المعرفة
بەیروت

ناوی کتێب بەعربـــــــی: الخليفة الراشد والمصلح الكبير عمربن عبدالعزيز
نوسینـــــــــی: علي محمد الصلابي
ناوی کتێب بە کـــــوردی: خەلیفەی نوێخوازو چاکساز عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله
وەرگێڕانـــــــــی: عمر تۆفیق الخطاط
بڵاوکـــــــــار: کتێبخانەی نارین
نەخشەسازی نـــــاوەوە: شنۆ حمدامین مجید
نۆرە و ساڵی چـــــاپ: یەکەم/ ١٤٣٠ك ـ ٢٠٠٩ز
شوێنی چـــــاپ: بەیروت ـ لبنان
ژمارەی سپـــــاردن: (١١٠٨)

**کتێبخانەی نارین**
هەولێر ـ چوارڕیانی شێخ مەحمودی حەفید
بازاڕی زانست بۆ کتێب وچاپەمەنی
تەلەفۆن : ٢٥١١٩٨٢-٦٦(٠٠٩٦٤)

E- mail: nareen_١@yahoo.com

# پێشەکی وەرگێڕ

الحمدلله وکفی والصلاة والسلام علی الهادی مصطفی وعلی اله وصحبه ومن دعا بدعوته الی یوم الدین...

خوێنەری بەڕێز، وەك خۆم زۆر سوپاسی ئەو کاتە ناسکانەت دەکەم، کە بەهەڵدانەوەو خوێندنەوەی ئەم کتێبەوە بەسەری دەبەیت.

هەروەك سوپاس وسەنای خوای پەروەردگارم دەکەم، کەجارێکی تریش یارمەتی دام، تا ژیان وبەسەرهاتی خۆرێکی تر لەخۆرە پرشنگ دارەکانی مێژووی زێرینی ئیسلام لەعەرەبی یەوە بکەم بەکوردی وپیشکەشی خوێندەوار ورۆشنبیرانی گەلەکەمی بکەم...

هەروەها مایەی دڵخۆشی یە، کەلەم سەردەمی بێ ئینسافی ودنیاویستی و دژایەتی کردنی بەرنامەکەی خواو گەلانی موسڵمان بەبەرنامەی وردوترسناکەوە لەلایەن زلهێزەکانی جیهان و ورد هێزەکانی ناموسڵمانانیش جێ بەجێیان دەکەن بۆیان.

ئالەم سەردەمە سەیرو سەمەرەدا، کەدەست گرتن بەرنامەکەی خواو سوننەتەکانی پێغەمبەری نازدار وەﷺ بەشەرمەوە مومارەسە دەکرێت، ئیتریان لەترساندا...یان لەبەر دەست نەدانی وەزیفەوپلەو پایە..یان لەبەر گاڵتەپێ کردن و تەریق کردنەوە...

هاوڕێ یەکم بۆی باس کردووم کەچی بەسەرهاتووە وچۆن گیراوەتەبەر گاڵتەو پێکەنین ولاقرتێ کاتێ لەگەڵ خێزانەکەیدا_دەچێت بەدەم دەعوەتنامەیەکەوە_ بەشداری شەکراو خواردنەوەیەك دەکات، بەتایبەت کاتێك بینیبوویان خێزانەکەی پۆشتە بوو جلی باق وبریق وتەنکی وای لەبەر نەکردبوو، کە هەموو باڵ ولەشی دیار

بێــــت، خۆیـــشی تەوقـــەی لەگـــەڵ کـــچەکاندا نـــەکرد بـــوو، بەشـــداری ڕەشبەڵەکە_حەڕامەکەشیان_ ی نەکردبوو... ئەویش لەترسی ئەوەی غەزەبی خـوا نەباری بەسەریدا ئـەو کۆڕەی ناشـەرعی یـەی بـەجێ هێشت ولـەدواوە لایکـردەوە کەسێك نەبوو لەناو گوناهـدا غـەرق نـەبوبێت. بۆیـە گـوێ نـەدا بەبۆنەکـەو لەگـەڵ هاوسەرەکەیدا پێکەوەو بەخێرایی هاتنەدەرەوە...

ئالەم سەردەمەدا دەیان وسەدان کەس کاتەکانیان داوە بەشتی بەسودو جوان و بەرهەم دار وکتێبخانەکان دەگەڕێن وکتێبە نایابەکان دەکڕن وخۆیان و یەکەیەکـەی ئەنـدامانی خێزانەکـەیان دەخوێننـەوەو خواردەمـەنی پێشکەشی مێشك ورۆحیـان دەکەن، خۆیان پڕچەك دەکەن بەزانیاری بەسودو پڕلە کەڵك بۆ خۆیـان وباشـتریش باس کردنی بۆ ئەندامانی نەتەوەکەیان...

دوای ئـەوەی سـوپاس بۆخـوا_لەسـەرەتاو کۆتـادا_ کـە دڵـی موسـڵمانانی کەمەندکێش کردوە بۆلای کتێبەکانم وئەوەش فەزڵی خوایـە چـونکە هەرئـەو کتێبـە کەسێکی تروەری دەگێڕێ وخویشی ماندوو دەکات، خـوا پاداشـتی هـەوڵ و مانـدوو بـوونی بداتـــەوە کەچـــی لەچـــاپی یەکەمـــدا دەوەســـتێت و لەکتێبخانەکانـــدا دەمێنێتەوە: ﴿ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ ﴾النمل: ٤٠.

بەڵام سوپاس بۆ خوا جارێکی تر، کە لەمانگی یەکەم ودووەمی دەرچوونی ژیانی (ابوبکری الصدیق)و ئیمامی(علی)دا، لەبازارەکاندا نەمان و خـەڵکی تەلـەفۆنیان بـۆ دەکردم لەشارەکانەوە کەچاپی بکەینەوە، چونکە نەماوە ودەست ناکەوێت.

وا ئەم جارەش دەچینە خزمەت کەسایەتی یەکی گـەورەی ئیسلام کـە(دوکتـور علی الصلابی)نووسیویەتی، بەندەیش ماوەی ساڵێکە لەهـەوڵی بـەکوردی کردنیـدام وسەرەنجام _سوپاس بۆ خوا_ کارەکەم گەیشتە ئەنجام...

ئـەو پیـاوە مەزنـەیش_عمـری کـوڕی عبـدالعزیزە رحمه الله کـە کەسـیٚ نـی یـە لـەناو موسڵماناندا ناوی نەبیستبێت و هـەواڵی دنیانەویـستی ودادپـەروەری و خواناسـی و پشگیری کردنی چەوساوەو ماف خوراوان و دژایەتی کردنی ستەمکارو مافخۆرەکانی نەبیستبێت...

کـاتی خـۆی لەهەشـتاکاندا زۆرم خـۆش دەویـست و تامـەزرۆی شـارەزایی بـووم لەورد و درشتی هەڵس وکەوتی ژیانی ڕۆژانەی، چونکە ووتەیەکی خواناسی ئیـسلام ماموستا(الحسن البـصری)م لەشـوێنێکدا بەرچـاوکەوت بـوو کەدەیفـەرموو(( بـەمن مەڵێن دنیانەویست (الزاهد)بەڵکو دنیانەویستی ڕاستەقینە عمری کـوڕی عبـدالعزیزە کەدنیا وخۆشی یەکانی بەهەموو توانا دەمی بۆ کردەوە وئەم پـشتی لـیٚ هـەڵکرد)) بەڵام لەوکاتەدا بەکوردی و لەو بارەیەوە نووسراوێکم بەرچاو نەکەوت.

ڕۆژان ڕۆشتن وڕۆژان هات وا خوای ـ عزوجل ـ کارێکی وای کرد خـۆم بەهرەمەنـد ببم بەوکارە گەورەیە وژیانی پڕلە بەرەکـەت و بەسـودی (عمـری کـوڕی عبـدالعزیز) بخەمە بەردیدی هاوزمانە خۆشەویستەکانم....

ئەزموونی ژیان ئـەوەی فێرکـردووم کـەهیچ شـتێك ئەوەنـدەی نموونـەی زینـدوو بەرچەسـتە کاریگـەر نـی یـە... بـۆ شـوێنکەوتوانی هـەموو بەرنامەیـەك، دەی ئـەم بەرنامـە بـەرزو بـڕ بەهایـەی پـەروەردگار نـەتێووری ونـەزەری یـەو لـەدوو تـویٚ ی کتێبەکاندا نەماوەتەوە وبەس، بـەڵکو سـەدان وهـەزاران پیـاوان وئافرەتـانی زانـا و خواناس هەڵکەوتوون ئەم بەرنامـە نـاوازە یـان کـردووە بـەکاڵای بـەریان لەژیانـدا و لـەدوای خوێـشیان هـەردەڵیٚ ی لەژیانـدان و گـەنج و لاوە موسـڵمانەکانی سـەدەی بیست ویەك دەچنەوە حزوریان،جەزبەی ئیمان وموسڵمانەتی ڕاستەقینە و زانست و زانیاریان لیٚ وەردەگرن...

عمـری کـوڕی عبدالعزیز_ دوو سـاڵ ونیو_ حـوکمڕانی وولاتـە یـەکگرتووەکانی ئیسلامی کردوە، بـەڵام گـەورەیی پرۆژەنوێخوازیەکـەی ئەوەنـدە مـەزن وگشتگیرو

بەبەرووبووم بوو کەوادەزانیت بەلایەنی کەمەوە(١٥تا٢٠)سالّ حوکمی کردووە.

لەوماوەکەمەدا کەس نەما لەپێش ئەودا ستەمێکی لێ کرابێت ولەسەردەمی ئەودا مافی خوراوی بۆ نەگەڕابێتەوە، یان مافی لەستەمکارێك نەسەندبێتەوە...

خزمەکانی خۆی دوورخستەوە کەهەموویان کوڕە خەلیفە وبرازاو خوشکەزاو پورزاو ئامۆزای خەلیفەکان بوون، هەموو ئەوانەیان کەبەناشایستەیی پۆستیان وەرگرتبوو لێ ی سەندنەوە، دای بەکەسانی زاناو تێگەیشتووان وخواناسان و دنیانەویستان.

لەوماوە کەمەدا زۆربەی زۆری سەرۆك کۆماری هەرێمەکانی لابرد - وێنەی حەجاج ی کوڕی یوسف - کەزولّمی زۆری لەگەلی عیراق دەکرد وتوندوتیژبوو لەگەلّیان،

بەپێچەوانەی حزبەکانی ئەمڕۆ کەخۆیان بەپێشکەوتوو، مودرێن ودیموکراتی خواز دەزانن کەچی کێ هیچ تیابەسەر وناشایستەیە دەیهێنن ودەیکەن بەبەرپرس و فەرمانڕەوا بەسەرگەلی داماوەوە تەنها لەبەر ئەوەی خۆی بەحیزبدا هەلّواسیوە کەحاکمی ولاّتە وئەویش دەیان ئەرزە وبەخششی جیاجیا دەبڕێت بۆ خزمەکانی خۆی ولایەنگرانی حیزبی حاکم!

کەچی خوێنەری ئازیز، ئەوە(عمری کوڕی عبدالعزیز)، ئەمیری باوەڕداران لەبڕبڕەپشتی ئەمەوی یەکانە و، بەلاّم کاتێ لەگەلّ ئامۆزاو کەسەکانی کەکۆدەبوویەوە دەیووت: ئادەی داوای پۆستم لێ بکەن؟ ئەوانیش عمریان دەناسی بۆیە دەیان ووت: گالّتەمان پێ مەکە ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆ پێمان وایە دەماندەیتێ ئەگەر داوای بکەین؟.

ئەویش دەیووت: وەللاّهی حەزناکەم ئەو بەرە شڕەی ژێرپێمتان بدەمە دەست چ جای دەستەلاّت وبەرپرسیارێتی ودارایی موسلّمانانتان بخەمە بەردەست!!

لەهەمووسەردەمێکدا ئەگەر کەسێکی خواناس وزانا ودنیانەویست هەڵبکەوێت و هەموو بڕگەو ئایەتە پیرۆزەکانی کەتەلۆکی ژیان ـ قورئـان وسـوننەت ـ جـێ بـەجێ بکات، بەهەموو دڵنیایی یەکەوە ـ خوێنەری ئەم کتێبە ـ بڕیاردەدات کەنەك مرۆڤەکان ئاسودە وکامەران وخۆش گوزەران دەبن بـەڵکو تەنانـەت باڵندەوگیانلەبـەرە کێـوی یەکانیش پشکیان بەردەکەوێت لەخۆشی و شادی ژیان لەژێرسێبەری قورئاندا.

کاتێ بە(عمری کـوڕی عبـدالعزیزیان ووت: (بیـت المـال) پڕبـووە وکـەس نـی یـە زەکات وخێر وەربگرێت، ئەویش فەرمووی: ژن بهێنن بۆ گەنجەکان، پاشـان وتیـان قوربـان هـەموو گەنجـەکان خێزانیـان بـۆهێنرا، فـەرمووی: پـردو خەسـتەخانە و میوانخانەی خێری پێ دروست بکەن. ووتیـان قوربـان ئـەوەشمان کـرد، فـەرمووی: دەی خواردن دروست بکەن ولەسەر کێوەکان دایبنێن، تا ئەو باڵندەو گیان لەبـەرە برسی وپیرو پەککەوتەو ناتوانەکان بیخۆن ولەبرساندا نەمرن!.

لەکۆتاییدا داوام وایە لەموسڵمانان بەگشتی وگەنج ولاوەکـان بەتایبـەتی ئـەمیری باوەڕداران عمری کوڕی عبدالعزیز بکەن سەر مەشقی خۆیان چونکە عمر لاو بـووە و لەتەمەنی(٢٥)ساڵیدا ئەمیری شاری مەدینەی پڕنـوور بـووە، لەتەمـەنی(٣٩)سـاڵیدا بووەتە(ئەمیری باوەڕداران) واتە: سەرۆکی هەموو وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئیـسلام و لـە(٤١)سـاڵیدا نـەیارانی پـرۆژە مەزنـە چاکسازی یەکـەی پیلانیـان بـۆ دارشـت و لەڕێگەی دەرمانخوارد کردنەوە شەهیدیان کرد.

دەی سەدان وهـەزاران رەحمـەتی نـەبڕاوەی خوابرژێـت بەسـەرگیانی پاکدائـەی گەورەمان، سەرمەشـقمان، نموونـەی موسـڵمانی ڕاسـتەقینەو بـێ غـەل و غـەش... ئاسـودەبە لـەگۆڕە پیرۆزەکەتـدا لـەوڵاتی شـامی (ابـو عبیـدەی جـراح)رَحِمَهُ اللهُ، کـە پەیامەکەت فەرامۆش نەکراوە لە هەموو گۆشەیەکی وڵاتە پان وپۆرەکەتدا سەدان و هەزار گەنجی خواناس ودنیانەویست و ڕوو لەمزگـەوت تـۆو دەکـەن، هـاو وێنـەکانی

تۆیان خۆش دەوێت ولەگەل هەموو تەوژمی دژایەتی یەکاندا پرۆژە چاکسازیە نوێخوازیەکەی ئیسلام بەتاکە چارەسەر دەزانن نەك تەنها بۆ چارەسەر کردنی کێشەی گەلەکەیان بەڵکو بۆ کێشەکانی سەرجەم ولاتانی دنیاو پاشەڕۆژیش بۆ دڵپاك و خواویستەکانە. (( والعاقبة للمتقين)).

تابەرهەمێکی تر هەموو خوێنەرانی ئەم ژیاننامەیە بەخوای بالادەست دەسپێرم

**والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته**

**عمر توفيق الخطاط**

هەڵەبجەی شەهید/ ٢٠٠٨ز- ١٤٢٩ك

# پێشەکی نووسەر

بسم الله الرحمن الرحيم

ان الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور انفسنا ومن سيئات اعمالنا، ومن يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، واشهد ان لااله الاالله وحده لاشريك له، واشهد ان محمدا عبده ورسوله، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾ ال عمران: ١٠٢

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ النساء: ١

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾ الاحزاب: ٧٠-٧١

يارب لك الحمد كما ينبغي لجلال وجهك وعظيم سلطانك، ولك الحمد حتى ترضى، ولك الحمد اذا رضيت، ولك الحمد بعد الرضا،

اما بعد:

ئەم کتێبە بەشێکە لەباسی دەوڵەتی ئومەوی لە گەشەو گەورە بوونەوە تا لاواز بوون و لەناوچوون و، دەربارەی چاکە خوازی گەورەو نوێکەرەوەی بەناوبانگ (عمری کوڕی عبدالعزیز) دەدوێت:

باس لە ژیان و گوزەرانی و هەوڵدانی بۆ دەستخستنی زانست و گرنگترین کارەکانی لە سەردەمی وەلید و سولەیماندا دەکات، لەگەڵ باسی خەلافەت و بەیعەت پێدانی و بەرنامەو پرۆگرامی لە بەڕێوە بردنی دەوڵەتدا و گرنگی دانی بە ڕاوێژ کردن و دادپەروەری، وسیاسەتەکانی لە نەهێشتنی زولم و ستەم و عەزل کردنی هەموو کاربەدەستە ستەمکارەکانی پێش خۆی.

هەروەها هەڵگرتنی ستەم لەسەر بەندەو خزمەت کارەکان و ئەهلی (ذمة)[1] و بەرپاکردنی دادپەروەری لەگەڵ خەلکی سەمەر قەند داو بوونی سەربەستیش بەشێوەیەکی گشتی لە دەوڵەتەکەیدا، وەك سەربەستی بیروڕا دەربڕین و هەڵبژاردنی باوەڕ و لایەنی سیاسی و تاکە کەسی، وسەربەستی بازرگانی و هەموو کاسبیەك.

هەروەك باسی گرنگترین سیفاتەکانیم کردووە وەك ڕادەبەدەر ترسانی لە خوای تەعالا و زوهد و دونیا نەویستی، خۆ بەکەم زانین و خۆ لە گوناه پاراستنی — الورع— و نەرم ونیانی و لێبوردەیی و گوزەشتکاری یەکانی، خۆ گری و بە گوڕ لێنەوینی، دادپەروەریەکانی و زۆر لالانەوەیی و پاڕانەوەی، قبوڵ کردنی دوعاکانی لەلایەن خوای گەورەو، دەربارەی نیشانەکانی نوێکاری دواوم لە لای عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله وەك شوری و حوکمڕانی کردن بە ئەمانەتەوە و دانانی کەسی شیاو ئەمین لە کارەکاندا، زیندوکردنەوەی بنەمای فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپەو لەگەڵ و بنەماکانی دادپەروەری دا.

هەروەك باسی مەرجەکانی نوێکاریم کردووە وەك بوونی بیرو باوەڕی پاك و دروست و خاوێنی پەیڕەو پرۆگرامی، زاناو موجتەهید[2] بێت، دەبێت بواری نوێکردنەوەکانی گشتگیر بێت لایەنی فیکرو بیرو باوەڕ و هەڵسوکەوتەکان بگرێتەوەو سود و کەڵکی بە گشتی بۆ هەموو خەڵکی سەردەمەکەی بێت.

هەروەها باسی گرنگی دانی عمری کوڕی عبدالعزیزم بە بیروباوەڕی پاکی ئەهلی سوننەو جەماعە کردوە وبەتایبەت لە مەسەلەی یەکتاپەرستی خودا، وناوە جوانەکانی و سیفاتە بەرزەکانی، دەربارەی زاراوەی - ئیمان - و باوەڕ بە ڕۆژی دوایی و هەموو مەسەلە غەیبی و نەبینراوەکان وەك سزای ناو گۆڕ و خۆشییەکانی و

---

١ـ اهل الذمة: هەموو کەسێك دەگرێتەوە کە موسلمان نی یە بەڵام لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژی.

٢ـ مجتهد: بەکەسێك دەوترێت دەستێکی باڵای هەبێت لە تێگەیشتن لە قورئان و سوننەت و زمانی عەرەبی و شارەزا بە ووتەو کردارەکانی هاوەڵان و ئەوانەشی دوای ئەوان هاتن، تا بتوانێت حوکمی نوێ لە قورئان و سوننەت دەربهێنێت. وەرگێڕ.

زیندووبوونەوە، کێشانەو حەوزی کەوسەرو پردی سیرات و بەهەشت و دۆزەخ و بینینی خوای گەورە لەلایەن باوەڕ دارانەوەو بانگەشە کردن بۆ دەست گرتن بە قورئان و سوننەت و هەلسوکەوتی خەلیفە راشیدەکانەوەو هەڵوێستی دەربارەی هاوەڵان و ئەو ناکۆکیانەی کەوتە نێوانیانەو هەروەها هەڵوێستی دەربارەی خانەوادەی پێغەمبەری خوا ﷺ - اهل البیت -.

پاشتر دەربارەی هەڵس و کەوتی لەگەڵ خەواریج و شیعەکان و قەدەریەکان دا دواوم، ئەمەو لەگەڵ ژیانی ناو کۆمەڵگەی، گرنگی دانی بە خێزان و منداڵەکانی و پرۆگرامی لە چۆنیەتی پەروەردەکردنی منداڵەکانیدا وەك هەڵبژاردنی مامۆستای و پەروەردەکاری باش و ساڵح بۆیان، دیاریکردنی پرۆگرامی زانستی و دیاری کردنی شێوازی فێرکردن، لەگەڵ دیاری کردنی کاتەکان و زانستە لە پێشترەکان و ڕەچاو کردنی کاریگەریەیە پەروەردە و پرۆگرامە پەروەردەییەکەی و ڕەنگ دانەوەی لە (عبدالملك)ی کوڕیدا.

هەروەها باسی ژیان و گوزەرانیم کردووە لە ناو خەڵکیداو گرنگیدانی بە چاکسازی کۆمەڵگە، بەردەوام بە یادهێنانەوەی ڕۆژی دوایی، ڕاستکردنەوەی تێگەیشتنە چەوتەکان و بوار نەدانی بە زیندوو کردنەوەی دەمارگیری و خێلاتی، ڕێزدانانی بۆ ئەهلی چاکەو دانەوەی قەرزی قەرزاران و ئازاد کردنی دیلە موسلمانەکان و دەرکردنی پێداویستی هەژارو نەداران، پێدانی مارەیی و ژنهێنان بۆ گەنجەکان، هەوڵدانی بۆ نزیك کردنەوەی چینەکانی کۆمەڵگە لە یەکتری، هەڵس و کەوتی باشی لەگەڵ شاعیرەکان و گرنگی دانی گەورەی بە زانایان و هاوبەشییان لە سەرخستنی پرۆسە چاکسازیەکانیدا، چاودێر پاڵپشتی بوون لە بەرنامەو پرۆگرامە چاکسازی یەکەیدا، ئامۆژگاری بەردەوامی بۆی و ترساندنی لە گەورەیی بەرپرسیایتی یەکە و ئامادەیی تەواویان لە وەرگرتنی هەرکارێك یان پلەیەك کە عمر لە دەوڵەتەیدا پێ ی بسپاردنایە.

دەربارەی قوتابخانە زانستیەکانی سەردەمەکەی و سەردەمی دەوڵەتی ئومەوی بە گشتی دواوم، وەك قوتابخانەی شام و حیجازو عیراق و میسرو...هتد. دەربارەی

پڕۆگرامی شوێنکەوتوانی هاوەڵان و ـ تابعین ـ لە تەفسیر کردنیان بۆ قورئانی پیرۆز و هەوڵ و تێکۆشانیان لە پێناو خزمەت بە سوننەت و ڕۆڵی عمری کوڕی عبدالعزیز خۆیشی لە نوسینەوەیدا .

هەروەك ئاماژەم کردووە بۆ پڕۆگرامی پاك کردنەوەی دڵ و دەروون و ڕەوشت بەرزی لەلای تابعین و قوتابخانەکەی (حەسەنی بەسری) م بە نموونە هێناوەتەوە و لەسەری بە درێژی دواوم و باسی هەندێ لە قوتابیەکانیشیم کردووە وەك ( ایوب السختیانی)مالیك ی کوڕی دینار و محمدی کوڕی واسیع،

باسی خۆپارێزی (حسن البصری) م لە(اعتزال — کەنارگیری) کردووە لەگەڵ پەیوەندی حسن البصری بە عمری کوڕی عبدالعزیزەوە و ئەو پەیامانەی بۆی دەنارد و تیایاندا ئاکارەکانی پێشەوای دادپەروەری لە ڕوانگەی خۆیەوە بەیان کردبوو .. هەروەك باسی هەڵوێستی (عمر)م کردەوە لە هۆکارەکانی هەڵگرتنی ئابڵوقەی (قسطنطینیة) و گرنگی دانی بە بانگەوازێکی گشتگیری.

هەستا بە دانانی یاسای خۆ یەکلایی کردنەوە(تفرغ) بۆ بانگ خوازان و زاناکان و هانی بڵاو بوونەوەی زانست و فێر بوونی دەدا و ئوممەتی ئیسلامی لە گرنگیەکەی ئاگادارده کردەوە، هەستا بە ناردنی زاناو مامۆستایانی خواویست بۆ شیمالی ئەفریقیاو شوێنەکانی تریش تا خەڵکی لە ئیسلام و ئەرك و پێداویستییەکانی شەرعیان فێر بکەن و نامەشی بە مەبەستی بانگ کردنیان بۆ لای ئیسلام بۆ پاشاکانی هیندستان دەنارد و هانی گەلانی بێباوەری دەدا، تا بێنە ناو ئیسلامەوە.

یەك جێباسیشم تایبەت کردووە بە چاکسازیەکانی عمر لە بواری سامان و دارایی‌دا، سیاسەتە ژیرەکانی لە و بوارەدا و سوربوونی لە سەر جێگیرکردنی هەق و دادپەروەری و نەهێشتنی زوڵم و ستەم، دووبارە دابەشکردنەوەی ماڵ و سامانەکان بەسەر موسڵماناندا لەسەر بنەمای عەدل و دادپەروەری و شایستەیی.

هەستا بە پیادەکردنی سیاسەتێکی نوێ بۆ بەرەو پێشبردنی کشتو کاڵ و لەو هەنگاوەیدا بڕیاری دا ئەو زەویانەی کە خەراجین فرۆشتنیان قەدەغە بکات، گرنگی دەدا بە جوتیاران و باجی لەسەر سوك دەکردن، زیاتر هانی خەڵکی دەدا بۆ گرنگی

دان بە ناشتن و چاندن و زیندوو کردنەوەی ئەو زەویانەی کە مردوون.

پاشـان هەسـتا بـە هەنـدێ کـاری زۆر ترسـناك و گـرنگ لەوانـە بڕینـی ئـەو زەویوزارانەی کە پێشتر تایبەت کرابوون بە خەلیفەکان و ئەمیری ناوچەکان و کوڕو خزم و کەس و کارەکانیان.

هـەروەها دەزگـای دادوەریـم کـردووە لەسـەر دەمەکەیدا و بـۆ چـونە فیقهیـیـە تایبـەتیکانیم بـاس کـردووە وەك قەدەغـە کردنـی دیـاری بـۆ بەرپرسـان و هەڵوەشانەوەی هەربڕیارو حوکمێك ئەگەر دەرکەوت بێچەوانەی دەقەکانی قورئان و سوننەتە.

دەربارەی سیاسەتە ئیداریەکانی قسەم کردووە و باسی والی یە بەناو بانگـەکانیم کردووە و وە چۆن هەستاوە بـە هەڵبـژاردنی والی و کاربەدەستـەکانی لـە خـەڵکانی خوانـاس و دەسـتپاك و چاکـساز، وسەرپەرشـتی کردنـی خـودی خـۆی بـۆ کـارە ئیداریەکان و توانای گەورەی خۆی لەبواری نەخشە دانان و ڕێکخستن و شێوازی لـە پاراستنی دەوڵەتەکەی لەگەندەڵی ئیداری، وەك زیادکردنی موچەی کاربەدەستان و پاراستنیان لە درۆکردن و وەرنەگرتنی هیچ جۆرە دیـاری و بەخـشش و زیـادەڕەوی نەکردن لە خەرج کردندا و نەیهێشتوە والی و کاربەدەستەکانی هیچ جۆرە کاسـبیەك بکەن، وهەستاوە بە دروستکردنی پردی پەیوەنـدی لـە نێـوان ئـەو کاربەدەسـتانەو میللەتداو لێپرسینەوەی وردی هەبووە لەگەڵیانـدا لـە بـواری پـارەو سـامان و (بیـت المال)دا.

پاشان باسی زاراوەی یەك سەرچاوەیی دەستەڵات (المرکزیە)وئازادی فیدرالیەتی ـاللامرکزیەـ ی عمـرم کـردووە و گرنگـی دانـی بـە بنـەمای پەلەنـەکردن و شـێنەیی ـالمرونەـ و ترەخان کردنی کاتەکان لە خزمەتی دەوڵەت و میللەتدا، هەوڵـەکانی بـۆ دابەشکردنی کارە ئیداریەکان.

ئاماژەیشیم کردوە بۆ سوور بوونی عمر لەسەر جێبەجێکردنی گشت بەندەکانی شـەریعەت بەسـەر دەوڵـت و ئوممـەت و کۆمەلگـەکان و تاکەکانـدا، ودەرکـەوتنی ئاسـەواری ئـەو دەسـتگرتنەی بـە حوکمـەکانی قورئـان و سـوننەت و ڕێنمـوونی یـە

جوانەکانی خەلیفە ڕاشیدەکان بە دەوڵەتەکەیەوە، وبەرقەرار بوونی ئاشتی و سەقامگیری و سەرکەوتن و رزگارکردنی وولاتان و سەربەرزی و بەرەکەت و خۆشگوزەرانی و لەگەڵ ئەم چاکسازە مەزنەشدا ژیاوم تا دوا ساتەکانی ژیانی و لە دونیا دەرچوونی.

دەرکەوتنی کەسایەتیەکی وەك عمری کوڕی عبدالعزیز لە قۆناغێکی مێژوویی نالەباردا، کە ئوممەتی ئیسلامی پێدا تێ دەپەڕی، وکۆشش کردنی لە پێناو گەڕانەوە بۆ ژیان لە ژێر سایەی شەریعەتی خاوێندا و ئاوێتە کردنی لەگەڵ ژیانی سەردەمی خەلیفە راشیدەکاندا وپابەندی تەواوی بە قورئان و سوننەوە، بەڕاستی دیاردەیەکی ناوازە بووە تەنها پاڵەوانێتی و لێبڕانی عمری کوڕی عبدالعزیز دەرناخات و بەس، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە ئیسلام بەردەوام لەتوانایدا هەیە بگەڕێتەوە ناو کۆمەڵگەو سەرکردایەتی ژیانی سیاسیو یاسایی و شارستانیان بکات و کۆمەڵگەکە دار ژێنێتەوە لە ناو قالبی بەرنامەو بیرو باوەڕەکەیدا.[١]

خەلافەتی عمری کوڕی عبدالعزیز بەڵگەیەکی مێژوویی گەورەیە و وەڵامێکی دەمکوت کەری بەهێزە بۆ ئەو کەسانەی نە شارەزایی دەمدەکوتن بۆ ئیسلام و دەڵێن: هەر دەوڵەتێك لەسەر بنەمای ئیسلام و شەریعەت دابمەزرێت ئەوە دەبێتە هۆی کۆمەڵێ کێشەو قەیران و لە هەموو ساتێکدا ئەگەری ڕوخان و لەناوچوونی هەیە، دروست بوونی ئەو دەوڵەتەیش تەنها خەونە و هەرگیز نایەتەدی! بەڵام مێژوو بەرامبەریان دەوەستێت و پێیان دەڵێت :﴿ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ البقرە: ١١١، واتە: دەی تەنها بەڵگەیەك بخەنەڕوو ئەگەر ڕاست دەکەن.

نورالدین ی زەنکی کە لە ساڵی ٥٦٨ ی کوچیدا وەفاتی کردوە، دووبارە لەسەر ئەو پرۆگرامەی عمری کوڕی عبدالعزیز هەنگاوی هەڵناو و کردیە نموونەو سەرمەشق

---

١ـ في التاصيل الاسلامي للتاريخ . د. عمادالدين خليل – ل٦٢.

بۆ خۆی، هەوڵە چاکسازیەکانی بەرووبوومی هاتەدی و بوو بەهۆی هەستانەوەی ئوممەتی ئیسلام سەر لەنوێ، وتوانی سەرکەوێت بەسەر دوژمنە خاچ پەرستە داگیرکەرەکان و لەسەر دەستی قوتابیەکی زرنگ و پاڵەوان (صلاح الدین الایوبی) شاری قودسی رزگارکردەوە، خوای گەورە نموونەی زۆر بکات لەم بارەی ئەمڕۆشماندا.

ووشەی چاکسازی وەك چۆن موسڵمانە ڕاستەقینەکان لێی گەیشتوون نەك ئەو شێوەیەی دوژمنانی ئەم ئاینە پاکە بانگەشەی بۆ دەکەن ـ مەبەستی سەرەکی ناردنی پێغەمبەران بوو. لەلایەن خوای (عز وجل)ەوە، ئەوەتا شوعەیب عَلَيْهِ السَّلَامُ ڕوو دەکاتە گەلە گومڕاو و گەندەڵەکەی لەبواری بیرو باوەڕداو پێیان دەڵێت : ئەی هۆزەکەم چی دەڵێن ئەگەر من راست بکەم و لەلایەن خواوە نێررابم و خودا خۆی ڕۆزی باراندبێت بەسەرمداو نامەوێت شتێکتان پێ بڵێم و خۆم پێچەوانەکەی بکەم، من تەنها مەبەستم چاکسازی و چاکەی ئێوەیە بە پێی توانا و کۆمەك و پشتگیرم بەس خودایە و پشت بەو دەبەستم و بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَرَزَقَنِى مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴾ هود:٨٨.

ئەم کارە مەزنەیش، کە چاکسازی بەشەرەکانە ــ لە دوای پێغەمبەری خوا محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و چوار یارە ڕاشیدەکەی و پیاوانی زاناو دانای وەك عمری کوڕی عبدالعزیز کاریان بۆ کردووە، ئای کە ئوممەتی ئیسلام ئەمڕۆ چەندێ پێویستی بەوەیە کە ڕەچەو ڕێبازی ئەو چاکسازانە بزانێت هەر لە پێغەمبەری خوداوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تا هەموو ئەو پیاوە مەزنانەی تر، چونکە ئەمڕۆ ئوممەتمان دووچاری دواکەوتوویی و سەرلێتێکچوون و پەرتەوازەیی و لاوازی و ژێر دەستەیی بووە .

گەڕانەوەمان بۆ لای فیقهی بزافی مێژووی ئیسلام بەرەو هۆکارەکانی هەستانەوەو سەرکەوین دەمانباتەوە وەك خاوەنی بیروباوەڕ و بەرنامە ڕوونی،

سەروەری شەرعی خوا لە وولاتدا، ودروست بوونەوەی سەرکردایەتیەکی رەببانی، کە نوور بڕوانێت و بەهێزی ئەوەوە بڕواتە مەیدانەوە، بەوگیانەوە لەگەڵ سوننەت و ڕێ ڕەوی خوداوە، هەڵس و کەوت بکات لە پەروەردەکردنی گەلان و دامەزراندنی دەوڵەت و لەناو بردنی.

زانینی هۆکاری بەهێز بوون و ڕووخانی گەلانی دونیاو نهێنیەکانی مێژوو، نەخشەو پلانەکانی دوژمنە بت پەرستەکان و جولەکەو بێباوەڕان و تاقمەکانی (الباطنية)و بیدعەچیەکان و، هەڵس و کەوتی شیاو لەگەڵ هەریەکە لەو تاقمانەدا.

مەسەلەکانی فیقهی ڕابوون و بەئاگا هاتنەوە و پرۆژەکانی هەستانەوەی درێژخایەن ئاڵۆزەو چووە بەناو یەکدا و کەس ناتوانێت پەی پێ بەرێت جگە لەو کەم کەس نەبێت کە بەجوانی لە قورئانەکەی پەروەردگار و سوننەتی پێغەمبەرە نازدارەکەی ﷺ گەیشتبن، پەیوەستیشیان کردبێت لەگەڵ فیقهی چوار خەلیفە راشیدەکە کەپیاوانی پێشینەی مەزن بۆیان نەقل کردووین، زانینی بەگشتی و تایبەتمەندیەکانی و هۆکاری هاتنەدی و هۆکاری تیاچوونی و سوود وەرگرتن لە مێژووی ئیسلامی و هۆکارەکانی هەستانەوە.

ئەو کاتە بۆی دەردەکەوێت ئەم ئوممەتە سەرکردایەتی و پێشەوایەتی خۆی لەدەست نەداوە مادام بەوەفا بێت بەرامبەر بە خوداو پێغەمبەرەکەیﷺو بزانێت کە تێکشکانی سەربازی شتێکی سادەیەو دەڕوات، بەڵام شکستی فەرهەنگی (الثقافي) برینێکی کوشندەیە، ڕۆشنبیری ڕاست و دروست تاکی موسڵمان پێ دەگەیەنێت و دواتر خێزانی موسڵمان و، پاشتر کۆمەڵگەی موسڵمان و بەدوایدا دەوڵەتی ئیسلامی دادەمەزرێنێت لەسەر پایەی بتەوی قورئان و سوننەت و ڕێڕەو رێنموونی سەردەمی راشیدین و ئەوانەشی بەڕێڕەوی ئەواندا ڕۆیشتن، لێهاتوویی ئیسلام لەدامەزراندنی کۆشکی شارستانیەتی ڕاست و دروست بوو بەهۆی ئەوەی، کە تا ئەمڕۆ قەلای بەرزی ئیسلام وەك خۆی بمێنێتەوە، پاش هاوکاری و کۆمەکی و پارێزگاری خوای - عزوجل -.

ژیانی عمری کوڕی عبدالعزیز فـام و تێگەیشتنی دروستی ووشـەی چاکسازیمان پێ دەبەخشێت وەك چۆن قورئانی پیرۆز فەرمانی پێ دەکات و زانـا چاکسازەکانی ئیسلام بەدرێژایی مێژوو لێ ی حاڵی بوون و جێ بەجێیان کردوە بەتـەواوەتی، نـەك ئەو تێگەیشتنە ڕۆژئاوایی یەی هاوچـەرخ، کـە ئاخنراوەتـە نێـو مێشکی سیاسـی و بڕیارە چاولێکەرەکانی ڕۆژ ئاواو و وای لێهاتووە کە وەك بەڵگە نەویستی لێ هـاتووە لەلای زۆری لەنەوەی نوێی موسڵمانان، کە گوایە شۆڕش زۆر گشتگیری ترو فراوان ترە لە ووشەی چاکسازی کە یەکەمیان زۆر بە توندی بەزەبر و زەنگ بارێکی نـوێ دەهێنێتە کایەوە، بەڵام ووشەی دووەمیـان کـە چاکسازیە گۆڕانکاریـەکی ڕیشەیی خاوی لەسەر خۆ دروست دەکات.

بـەڵام زۆر ناحـاڵین لـەوەی کـە چاکسازی بـەو مانایـەی قورئـان هێناویـەتی زۆر گشتگیری ترو فراوانترە لە ووشەی شۆڕش، چـونکە هەمیـشە دەیـەوێت مرۆڤایـەتی چـاکترو بـەرەو خـرابتر بـڕوات و تـەنها گـۆڕینی دەسـتەڵاتە بـە دەسـتەڵاتێکیتر و حاکمێك بە حاکمێکی تر.[1]

عمری کوڕی عبدالعزیز نموونویەکی زیندووی چاکسازیيە و سەر مەشقە بـۆ هـەر کەسێك بیەوێت لەسەر بەرنامەو پرۆگرامی پێغەمبەرانەو خەلیفـە راشـیدەکانی دوای ئەو هەنگاو بنێت، بەراستی دڵسۆزانەو لێبڕاوانە دەستی دایە کارە چاکسازیەکەی و خوای گەورەش سەرکەوتنی خستە ئەستۆی خۆی و وای کرد لە هەموو خـەڵکی کـە کارەکەی بە مەزن سەیر بکەن و باسی چاکەی بکەن.

هەروەك شاعیر احمد المهوی اللیبی دەڵێت:

فاذا احب الله باطن عبده ... ظهرت علیه مواهب الرحمن

واذا صفت لله نیة مصلح ... مال العباد علیه بـــالارواح

داوا کـارم لـە خـوای تعـالی، کـە ئـەم کـارەم لێـوەر بگرێـت و تـەنها لەبـەر ئـەو کردوومەو بۆ سوودو کەڵکی بەندەکانی، پاداشتی من و هەموو ئەوانەیشی هاوکاریان

---

١ـ اثر الامام محمد بشیر الابراهیمي (٦/٢).

کردم لە بڵاو کردنەوەیدا بداتەوە.

هەروەك داوام وایە لە هەموو خوشك و برایەکی موسڵمان کە ئەم کتێبەم دەخوێننەوە ئەم بەندە هەژارو داماوەی ڕەحمەت و لێبوردنی پەروەردگاریان لەبیر نەچێت لە دوعاکانیاندا.

﴿رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ النمل: ١٩.

سبحانك اللهم وبحمدك اشهد ان لااله الاانت استغفرك واتوب اليك، واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

بەندەی هەژارو موحتاج بە ڕەحمەتی پەروەردگاری

**علی محمد الصلابی**

# بەشی یەکەم

# لەدایك بوونەوە، تا خەلافەت

## یەکەم: ناو وشورەت و نازناو و خانەوادەکەی

ناوی عمری کوڕی عبدالعزیز ی کوڕی مەروانی کوڕی حەکەمی کوڕی ئەبی عاصی کوڕی کوڕی ئوممەیەی کوڕی عبدشمس ی کوڕی عبدالمناف.

پێشەوای و زانای لێهاتووی دونیا نەویستی خواناس و، بەڕاستی ئەمیری باوەڕداران، (ابو حفص القرشی الاموی المدنی)، پاشان (المصری) خەلیفەی دونیا نەویستی راشید ـ سەرشکاوی بەنی ئوممەیەو،[1] لە پێشەوایانی (ئیجتهاد) و لە خەلیفە راشیدەکان بووە.[2]

ڕەوشت جوان و شێواز جوان بووە، بەتەواوی ژیر بووە، هەڵس و کەوت بەرز بووە، سیاسەت مەداری لێهاتوو بووە، سوور بووە لەسەر دادپەروەری بە هەموو توانایەکی یەوە، فەرهەنگێکی زانیاری بووە، وشارەزابووە، وزیرەك و تێگەیشتووی خاوێن بووە، زۆر خواناس و تەوبەکار بووە، وزۆر بەبەندایەتی کاربووە بۆ خودا، لەگەڵ خەلافەتەکەیدا زۆر دونیا نەویست بووە، زۆر هەق بێژ بووە لەگەڵ کەمی هاوکارانیدا، زۆری فەرمانڕەوا ستەمکارەکان ئەوانەی لایی قاس بوون و خۆیان بۆ دەخواردەوەو ڕقیان لە هقبێژییەکەی بوو، گرتنەوەی مووچەو مانگانەکانیان و لێسەندنەوەی زۆرێ لەو شتانەی دەستیان کەوتبوو بە ناڕەوا، بەردەوام پیلانیان بۆ دادەنا تا ئەوە بوو لە ئاکامدا دەرمان خواردیان کردوو گەیشتە پلەی شەهیدی و بەختەوەری.

---

١ـ سیر اعلام النبلاء (١٤٤/٥) .

٢ـ هەمان سەرچاوە (١٤٤/٥)

لەلای زانایانی ئیسلام بە یەکێ لە خەلیفە ڕاشیدەکان دادەنرێت و یەکێ لە زانا کردەوە کارەکان[١] و ئەو پیاوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ ــ زۆر ڕەوانبێژو قسە زان بووە[٢]

**١ـ باوکی عمر:** باوکی ناوی عبدالعزیزی کوڕی مەروانی کوڕی حەکەم بووە، ویەکێ بووە لە فەرمانڕەوا چاکەکانی ئومەویەکان، زۆر ئازاو بەخشندە بووە، وزیاتر لە (٢٠) ساڵ فەرمانڕەوای میسر بوە.

ئەو پەڕی خۆپارێز بووە لە گوناە و حەرام بە بەڵگەی ئەوەی کە کاتی ویستی ژن بخوازێت بە خزمەتکارەکەی ووت: لە پارەوماڵی حەلالم (٤٠٠) دینار جیابکەرەوە — ئەوەی بە دەستی خۆم پەیدام کردبێت — چونکە دەمەوێت لە خانەوادەیەك ژن بخوازم کە زۆر چاك و چاکسازن.[٣]

ئەوە بوو (ام عاصم) ی کچی عاصمی کچی عمری کوڕی خطابی خواست ﵁ کە کچە زای ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خطابە، هەندێکیش دەڵێن ناوی (لیلی) بووە.[٤]

هەروەك چۆن بنەماڵەی عمری کوڕی خطاب ژنیان پێ نەدەدا ئەگەر نەیانزانیایە پیاوێکی باش و ئەهلی چاکەو چاکسازیە، هەر لە لاوێتی دا کوڕێکی ڕەوشت بەرز بووە، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام لەهەوڵی دەست خستنی زانست و زانیاریدا بووەو گرنگی تایبەتی بە فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ داوە، ولە خزمەت هاوەڵی بەڕێز ئەبوهورەیرو هاوەڵانی تردا بووە و فەرموودەی لێبیستوون، تەنانەت پاش ئەوەش کە بوو بە والی میسر داوای کرد لە (کثیر) کوڕی (حرة) لە شام چی فەرموودەی پێغەمبەری خوای بیستووە بۆی بنێرێت جگە لە فەرموودەکانی لای

---

١ـ سیر اعلام النبلاء (١٢٠/٥).

٢ـ هەمان سەرچاوە (١٣٦/٥).

٣ـ الطبقات الکبری (٣٣١/٥).

٤ـ عبدالعزیز بن مروان وسیرته واثره فی احداث العصر الاموی لا٥٨.

ئەبوهورەیرە، چونکە دەیووت: ئەوانە لەلای خۆم هەن.[١]

باوکی عمر دڵی بۆ کاری زۆر گەورە لێی دەدا، هەر لە لاوێتیەوە و تا پاش والێتی. کاتێ لە لاوێتی دا بە ماڵەوە چوونە میسرو ئەو کوڕێکی گەنج بوو هەر بەو منداڵیەوە دڵی بۆ والێتی لێ دەدا، دواتریش دەستی کەوت، پاشان ئارەزووی دەرماڵداری و نان بەخشینی تێدا دروست بوو، ئەوەبوو بوو بە بەخشندەترین ئەمیرەکانی دەوڵەتی ئومەوی،[٢] و هەموو ڕۆژێك لە دەوروبەری ماڵەکەیدا سفرەی دەڕازاندەوە و هەزار سینی خواردنی دەدا بە هەژاران و (١٠٠) سینی خواردنیشی بە ناو هۆزەکاند دەگێڕا.[٣] و لە بەخشندەیی یدا دەڵێت: (ئەگەر کەسێك بوارم بدات دەستێکی یارمەتی بۆ درێژ بکەم گەورەتر و چاکترە لەلام لەوەی من دەستم هەبێ لەلای ئەو).[٤]

مێژوونووسەکان زۆر وەسفی ماڵ بەخشینەکانی عبدالعزیزیان کردووە، ئەو ماڵبەخشین و دەست و دڵ جوانی یەش بەڵگەی تەواوی ئەوەیە کە یەقینی تەواوی بەوە هەبوو کە چی ببەخشیت خوای گەورە دەیخاتەوە شوێنەکەی و جێگەی پڕ دەکاتەوە، لە ووتەیەکیدا دەڵێت : (عجبت لمؤمن یؤمن ان الله یرزقه ویخلف علیه، کیف یحبس ماله عن عظیم اجر وحسن ثناء؟!) واتە: لە باوەڕدارێك سەرسام دەبم کە باوەڕی وایە خوا ڕۆزی دەدات و شوێنی خێرکردن پڕ دەکاتەوە کەچی ماڵ نابەخشێت و پاداشتی گەورەو وەسفی چاکە لە دەست خۆی دەدات ؟! کەسێك بوو لە خوا ترس بوو، لە خوا ترسیەیەکەیشی بە ووتەیدا دەردەکەوێت، کە لەسەرە مەرگدا ووتوویەتی: ((وددت انی لم اکن شیئا مذکورا، لوددت انی اکون هذا الماء الجاری او نبتة بارض الحجاز)، واتە: ئاواتە خوازبووم من هەر باس و خواستم نەبوایە، زۆر بە ئاواتەوەم ئەو ئاوە بوومایە کە دەڕوات یان درەختێك بوومایە لە

١ـ سیر اعلام النبلاء (٤/٤٧).
٢ـ الولاة وکتاب القضاة للکندی لا٥٤.
٣ـ معجزة الاسلام خالد محمد خالد لا٥٥
٤ـ الخطط للمقریزی (١/٢١).

دەشتی حیجازدا:[١]

**٢ـ دایکی عمر:** (ام عاصم) کچی عاصم کوڕی عمر کوڕی خطاب ﷺ و باوکی عاصم ی کوڕی عمری کوڕی خطابە، شارەزاو زانا، بە (ابو عمرو القرشی العدوی) ناو بانگی دەرکردبوو، لە ڕۆژەکانی سەردەمی ژیانی پێغەمبەردا لە دایك بووە و لە باوکی یەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، دایکیشی ناوی جەمیلەی کچی (ثابت)ی کوڕی (ابی الاقلع)ی ئەنصاری یە، پیاوێکی کەڵەگەت بووە و لە ڕیزی پیاوە بەرزەکاندا بووە لەموسڵمانەتی و چاکەو خواناسیدا،ڕەوانبێژ،زمان پارا و، شاعیر بووە، باپیری خەلیفە عمری کوڕی عبدالعزیز بووە لە دایکەوە، لەساڵی ٧٠ی کۆچی یدا گیانی سپاردووە و (ابن عمر) ی برا بۆی گریاوەو بەشیعرەوە ووتوویەتی:

فلیت منایا کن خلفن عاصما فعشنا جمیعا او ذهبن بنا معا [٢]

واتە : خۆزگە مردن عاصمیان نەبردایە تا هاوژین و، یان پێکەوە بمردینایە

بەڵام داپیرەی لەلای دایکی یەوە، خاوەنی هەڵوێستێکی مەزنە لەگەڵ عمر بن الخطابدا ﷺ لە عبدالله کوری زوبەیری کوڕی ئەسلەمەوە و ئەویش لە ئەسلەمی باپیریەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: جارێکیان من و عمری کوڕی خطاب لە شەودا بەناو کۆڵانەکانی مەدینەدا دەگەڕاین، تا عمر ﷺ شەکەت بوو لە لای دیوارێکدا شانی داهێڵا، تا کەمێ بحەوێتەوە، لەو کاتەدا گوێمان لێبوو ئافرەتێك بە کچەکەی دەووت: کچی خۆم، هەستە بڕۆ ئاو بکەرە ناو شیرەکەوە کچەکەی ووتی: ئەی نازانی عمری کوڕی خطاب چ بڕیارێکی دەرکردووە؟ ووتی: نازانم چ فەرمانێکی دەر کردووە؟ کچەکەش ووتی: جاڕچیەکەی جاڕی داوە، کە هیچ کەس نابێت ئاوبکاتە ناو شیرەوە. دایکیشی پێی ووت: کچی خۆم هەستەئاوەکە بکەرەناو شیرەکە، ئێستا کەی عمرو جاڕچی یەکانی ئاگایان لێیە.

---

١ـ البدایة والنهایة لە — عبدالعزیز بن مروان — لا٥٦٧ وەرگیراوە.

٢ـ سیر اعلام النبلاء (٤/٩٧).

کچەکەیش ووتی: وەڵڵاهی دایەگیان من لەناو خەڵکدا بە قسەی ناکەم و لە چۆڵەوانیدا قسەی بشکێنم، عمریش گوێی گرتووە بۆ ئەم گفتو و گۆیە و ڕووی کردە (ئەسلەم) و پێ ی ووت: ئەی ئەسلەم ئەم دەرگایەم بۆ دیاری بکەو شوێنەکەت لێ تێك نەچێت، پاشان چوون بەدەم گەڕانەکەیانەوە. کاتێ ڕۆژ بوویەوە ووتی: ئەسلەم بڕۆ بۆ ئەو جێگایە و بزانە کێ ئەو ووتەیەی ووتووە، کێیش ئەو وەڵامەی داوەتەوە؟ وەئایا بزانم مێردی هەیە؟ و منیش چووم بۆ ئەو ماڵەو دەبینم کچەکەی شوینەکردوە و دایکیشی مێردی نەماوە، گەڕامەوە بۆ لای عمر و هەواڵەکەم پێ دا، ئەویش کوڕەکانی کۆکردەوە و پێی ووتن کامتان ئەتانەوێت ژن بهێنن با ژنی بۆ بهێنم؟ و عاصم ووتی: باوکە گیان من ژنم نییە، ژن بۆ من بهێنە، جوابی نارد بۆ ئەو کچە و هێنای بۆ عاصم و کچێکیان بوو، لەو کچەیش عمری کوڕی عبدالعزیز بوو.[١]

دەگێڕنەوە شەوێکیان عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه خەوی بینی و لە سبەینێدا ووتی: خۆزگە ئەو خاوەن نیشانەیە کێ بێت لە نەوەکانی من کە زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری هەروەك چۆن پڕ کراوە لە زوڵم و ستەم.[٢]

عبدالله ی کوڕی عمر رضي الله عنهما دەیووت : بنەماڵەی خطاب وا گومانیان دەبرد کە بیلال ی کوڕی عبدالله ئەو کەسەیە کە لە خەودا مژدەیان داوە بە عمر بەو نیشانەیەدا کە پێوەی بوو، تا ئەوەبوو عمر ی کوڕی عبدالعزیز هاتە دونیاوە[٣] ــ واتە دەرکەوت ئەوە نەك بیلال ــ

**٣ـ شوێن و ساڵی لەدایك بوونی عمر:** زاناکان جیاوازیان هەیە لە مێژووی لە دایك بوونەکەی، بەهێز ترینیان ئەوەیە کە لەساڵی ٦١ ی کۆچی دا لە دایك بووە ئەم ڕاستیە پەسند کراوە چونکە ساڵی ١٠١ ی کۆچی وەفاتی کردوەو هەموو مێژوو

---

١ـ سیرة عمر، ابن عبدالحکم لا ١٩–٢٠ وسیرة عمر لابن الجوزی لا١٠.

٢ـ سیر اعلام النبلاء (١٢٢/٥)

٣ـ هەمان سەرچاوە.

نوسانیشلەسەر ئەوەن کە لە تەمەنی (٤٠) ساڵیدا کوچی دوایی کردووە.[١]

هەندێ لەسەر چاوەکان باس لەوە دەکەن کە لە میسر لە دایك بووە، وئەمەش رایەکی لاوازە، چونکە عبدالعزیزی باوکی لەساڵی (٦٥)ی کۆچیدا بوو بە والی میسر، پاش ئەوەی مەروانی کوڕی حەکەم لە عبدالله ی کوڕی زبیرﷺ سەندەوەو عبدالله ی کوڕی کرد بە والی ئەوێ . و هیچ سەرچاوەیەکیش ئاماژە بۆ ئەوە ناکات کە عبدالعزیز پێش بە والی بوونی لەمیسر ژیا بێت؛ بەڵکو خۆیی و بنەماڵەکەی کە (بنی مروان)ە لە مەدینە ژیاون.[٢] (الذهبی) دەڵێت: لەسەر دەمی یەزید دا لە شاری مەدینەدا لە دایك بووە.[٣]

**٤ ـ سەرشکاوی بەنی ئومەیی یە:** عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله نازناوی دەرکردبوو بە (اشج بنی مروان) واتە سەرشکاوی بەنی ئومەیەیە، ئەوەش لەبەر ئەوە بوو کاتێ منداڵ بوو، چووبووە ناو گەوڕەکەی باوکی کە والی میسر بوو ــ بۆ سەیری ئەسپ و یەکێکیان لە قەیەکی لێداو سەری شکاند، باوکیشی خوێنەکەی دەسڕی و دەیووت : ئەگەر تۆ سەر شکاوی بەنی ئومەیەیە بی ئەوە کەسێکی بەختەوەریت.[٤]

کاتێ (اصبغ)ی برای شوێنی شکانەکەی سەری بینی ووتی: الله الکبر ئەمە سەرشکاوەکەی بنی مروانە کە دەبێتە پادشا، وعمری کوڕی خطابﷺ وتوویەتی : لە نەوەکانی من پیاوێك دێت بە دەم و چاویەوە شوێنەوارێکی شکان هەیە و زەوی پڕ دەکاتەوە لە عەدل و دادپەروەری.[٥]

عمرالفاروق ﷺ کاتی خۆی خەوێکی لەو بارەیەوە بینی و کەسانی تریش دوای خۆی هەمان خەویان بینیبوو، تا وایان لێهاتبوو ئەو هەواڵە بوو بوو بە شتێکی

١ـ البدایة والنهایة (١٢/٦٧٦).
٢ـ الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزیز (١/٥٤).
٣ـ تذکرة الحفاظ (١/١١٨–١٢٠).
٤ـ البدایة والنهایة لە فقه عمر بن عبدالعزیز وەرگیراوە (١/٢٠).
٥ـ المعارف لابن قتیبة ل٣٦٤.

مەشهورو هەموویان بە تەمابوون ئەو کەسە دەربکەوێت چونکە بە ووتەکەی باوکی عمر و (اصبغ) ی برایدا دەردەکەوێت.[١]

**٥ـ براکانی عمر:** عبدالعزیزی کوڕی مەروان (١٠) کوڕی هەبووە، کەئەمانەن : عمر و ئەبوبەکر و محمد و عاصم و، ئەمانە لە بلابوون، لەیلایش کچی عاصم ی کوڕی عمری کوڕی خطاب بوو، لە خێزانی تریش شەش کوڕی هەبووە، ناوەکانیان: (الاضبع) سەهل و سوهەیل و (ام الحکم)و زبَّان و ام البنین.[٢]، دایکی عمر بەعاصم شورەتی دەرکردوە و پێیان وتووە (ام عاصم).[٣]

**٦ـ منداڵەکانی عمر** رحمه الله: عمری کوڕی عبدالعزیز (١٤) کوڕی هەبووە، لەوانە: عبدالملك و عبدالعزیزو عبدالله و ابراهیم و اسحاق و یعقوب و بکرو ولیدو موسیو عاصم و یزیدو زبَّان و عبدالله.[٤]

سێ کچی هەبووە، ئامینەو (ام عمار)و (ام عبدالله)و کاتێ عمر ی کوڕی عبدالعزیز گیانی سپارد هیچ میراتێکی بۆ بەجێ نەهێشتن جگە لە هەندێ پارەی کەم و کوڕەکان تەنها(١٩) دەرهەمیان بەر کەوت، لە کاتێکدا تەنها یەکێك لە کوڕەکانی هشام ی کوڕی عبدالملك هەزار هەزار ــ ملیون ــ ی بەرکەوت، کەچی چەند ساڵێکی کەم تێنەپەڕی یەکێ لە کوڕەکانی عمریان بینی کە لە یەك ڕۆژدا(١٠٠) ئەسپی بە بارەوە دەبەخشی لە ڕێگەی خودا و لە هەمان کاتدا کوڕێکی هشامیان بینی لە کەعبەدا خەڵکی خێریان پێ دەکرد ! دەی پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری جیهان.[٥]

---

١ـ فقه عمر بن عبدالعزیز د. محمد شفیر (٢٠/١).
٢ـ المعارف لابن قتیبة، لا ٣٦٢.
٣ـ فقه عمر بن عبدالعزیز (٢٢/١).
٤ـ فقه عمر بن عبدالعزیز (٢٣/١).
٥ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز لابن الجوزی لا٣٣٨.

٧ـ **خێزانەکانی:** عمر لە شاری مەدینەدا گەورەبوو، رەوشتی بەرزی خەڵکی ئەو شارەی وەرگرتبوو، زاناکان کاریگەریان لەسەر دانابوو و ئەویش بە لێبڕانەوە دەستی کرد بە وەرگرتنی زانست لێیانەوە، هەمیشە لەگەڵ زاناو پیاو ماقوڵەکانی قورەیشدا دادەنیشت و لە پێڕی گەنجان خۆی بەدوور دەگرت، ورەوشتی بەو جۆرە بوو تا ناوبانگی دەرکرد، وکاتێ باوکی مرد، مامەی عبدالملك ی کوڕی مروان کە ئەمیری باوەڕداران بوو هێنایە لای خۆی و خستیە ناو کوڕەکانی خۆی، لە زۆر بەیشیان خۆشتری دەویست و کچەکەی خۆیشی کە فاطمەی ناوبوو لێی مارە کرد.[١]

فاطمە ئافرەتێکی زۆر صالح و خواویست بوو، عمری هاوسەری زۆر کاریگەری تێکردبوو، تا وای لێکرد لەگەڵ ئەوەدا کە کچە پاشا بوو ، بەڵام هەموو خۆشی دنیای خستە ئەولاوەو لەبەر خاتری خوای گەورە عمری کوڕی عبدالعزیزی هەڵبژارد. و لەبارەیەوە شاعیرێك دەڵێت :

بنت الخليفة والخليفة جدها     اخت الخلائف والخليفة زوجها

واتە: کچە خەلیفە بوو باپیریشی خەلیفە بوو خوشکی خەلیفان و خەلیفەش هاوسەری بوو.

مانای ئەم شیعرەش ئەوەیە، کە کچی خەلیفە عبدالملك ی کوڕی مروان بوو و باپیریشی خەلیفە مروانی کوری حەکەم بوو، هەروەك خوشکی کۆمەڵێ خەلیفە بوو لەوانە: وەلید و سلیمان و یزید و هشام ی کوڕانی عبدالملك کە هەموویان خەلیفە بوون و هاوسەرەکەشی خەلیفە عمری کوڕی عبدالعزیزرحمه الله بوو، تا هەندێ وتوویانە: ئەمڕۆ هیچ ئافرەتێکی موسڵمان ئەو سیفەتانەی فاطمەی تێدا نییە.[٢]

فاطمە ش لە عمر سێ کوڕی بووە، ئیسحاق و یەعقوب و موسا.

خێزانەکانی: لەمیس ی کچی عەلی کوڕی حارث، کە عبداللە و بکر و (ام عمار)ی لێ بووە، خێزانێکی تری بەناوی(ام عثمان)ی کچی شوعەیب و زەبان و لەو خێزانەی

---

١ـ البداية والنهاية (١٢/٦٨٠).
٢ـ البداية والنهاية (١٢/٦٨٠).

(ئیبراهیمی) لێ بوو.

منداڵـەکانی عمـر: عبـدالملك و ولیـد و یزیـد و زبـان و امینـه و (ام عبـدالله) و دایکیشیان (ام الولید) بووە.[١]

**٨ـ شێوازی عمر:** عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله پێستی ئەسمەر بووە و دەمو و چاو باریك و زۆر جوان، لاشەیشی لاواز بووە، ریشی جوان بووە، چاوی قـوڵ بـووە، لـە نەخشی توێلیدا شوێنەواری لەقـەی ئەسپەکەی پێوە دیار بـووە، کـە لەشـێوەی هێلێکی کورتدا بوو[٢] . ، بەڵام لـە ریوایـەتێکی تـردا دەڵـێن : دەم و چاوی باریـك و سپی پێست بووە و لەشیشی لاواز بووە و ریشی جوان بووە.[٣]

## دووەم: هۆکارەکانی دروستبوونی کەسایەتی عمری کوڕی عبدالعزیز

### ١ـ کاریگەری خێزانی:

عمر رحمه الله لە شاری مەدینەدا گەورەبوو، کاتێ فام و ئاوەزای گرت هەر بـە منـداڵی سەردانی عبدالله ی کوڕی عمری کوڕی خطابی دەکرد. کە مامەی دایکی بـوو، کـاتێ دەگەڕایـەوە بـۆ ماڵـەوە بـەدایکی دەووت: زۆر حـەز دەکـەم وەك خـاڵم لێ بێـت مەبەستی ـ ابن عمر ـ بووە، هەناسەی بۆ هەڵکێشاوە، ودایکیـشی پـێ ی ووتـووە: لەبـەر چـاوم وون بـە، تـۆ دەتـەوێت وەك خاڵـت بیـت؟!. چـەند جارێـك ئەمـەی دووبارەوە دەکردەوە.

کاتێ گەورە بوو، باوکی کرا بە والی میسر و بە ماڵـەوە رۆشـتن بـۆ ئـەوێ، لـەوێ نامەی ناردەوە بۆ(ام عاصـم)ی خێزانـی تـا خـۆی و عمـری کـوڕی بێـنن بـۆ لای بـۆ میسر...(ام عاص) میش نامەکەی دایـە دەسـتی مامـەی ـ عبـدالله ی کـوڕی عمرـ ، ئەویش پێی ووت: خـۆتی پێبگەیەنـە ئـەوە هاوسـەرتە و کـاتێ (ام عاصـم) خـۆی خستە رێ،(عبدالله) چووەرێگەی و پێـی ووت: ئـەم منداڵـەمان لـەلا بـەجێ بهێڵـە .

---

١ـ سیرة عمر بن عبدالعزیز لابن الجوزی لا ٣١٤ , ٣١٥.

٢ـ الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزیز فی العقیدة (٥٨/١).

٣ـ الكتاب الجامع لسیرة عمر بن عبدالعزیز (١١/١).

مەبەستی عمر بوو، چونکە لە هەمووتان زیاتر شێوەی دەچێتەوە سەر بنەماڵەکەمان ـ ئال خطاب ـ و ئەویش دڵی نەشکاندو عمری لەلا بەجێ هێشت.

کاتێ گەیشتە میسر، یەکسەر عبدالعزیز ی هاوسەری بۆ عمری ڕوانی، بەڵام نەیبینی، بۆیە بەسەر سوڕمانەوە پرسی : ئەی عمر کوا ؟ و ئەویش مەسەلەکەی (ابن عمر)ی بۆ باس کرد و داوا کاریەکەی (ابن عمر) و ووتەکەشی کە ووتی لە بنە ماڵەکەمان دەکات، عبدالعزیز بەو هەواڵە زۆر دڵخۆش بوو، بۆیە نامەی نووسی بۆ عبدالملك کوڕی مەروانی برایی و هەواڵەکەی بۆ باس کرد، عبدالملك یش بڕیاریدا هەموو مانگێ (١٠٠٠) دیناری بۆ ببڕێتەوە، پاشان دواتر (عمر) بە ویستی خۆی گەڕایەوە بۆ لای باوکی لە میسر.[١]

ئا بەو جۆرە عمرڕحمه‌الله لەسەر دەستی خاڵۆکانی پەروەردە کرا و لە نێوان خانەوادەو بنە ماڵەی عمری کوڕی خطاب دارضي‌الله‌عنه و گومانیشی تێدا نیەیە کە کاریگەری ئەو خانەوادە پیرۆزە بەتایبەتی و کۆمەڵگەی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەبەری خواﷺ بە گشتی لەسەر بووە.[٢]

## ٢ـ گرتنی ڕێگای زانست و زانیاری و لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز:

عمری کوڕی عبدالعزیز هەر لە منداڵیەوە بەهرەی ئەوەی پێبەخشرابوو کە حەزی بووە لە زانست و خوێندنەوە و ووتوو وێژ لەگەڵ زاناياندا، و بەردەوام لە دانیشتن و وانەکانی هاوەڵان دوا نەدەکەوت لە شاری مەدینە کە لەو کاتەدا ئەوی منارەی زانست و چاکسازی بوو، وجمەی دەهات لە زانا و دانا و شەرع زانان و چاکسازان و پیاوچاکان.

هەر لەسەر دەمی منداڵی یەوە شەیدای زانست بوو بوو، هەر کە نیشانەی پێگەیشتنی لێدەرکەوت حەزێکی پڕ تاسەیشی لە وەرگرتنی زانست و زانیاری تێدا دەرکەوت.[٣]

---

١ـ سیرة عمر لابن عبد الحكم لا٢٤–٢٥.

٢ـ الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزیز فی العقیدة (١/٥٦).

٣ـ البدایة والنهایة (١٢/٦٧٩).

هەر بە منداڵی هەموو قورئانی خوێندوو لەبەریشی کرد، چونکە خاوەنی بیر و هۆشێکی ساف و بێگەرد و توانایەکی لە ڕاددەبەدەر بوو، لەلایەك و لەلایەکی ترەوە خۆی یکلایی کردبوویەوە بۆ ئەو بوارەو هەموو هەوڵ و کۆششێکی دەستخستنی زانست و زانیاری بوو.

قورئانی پیرۆز زۆر کاری تێکردبوو، لە تێڕوانینی ئایەتەکان بۆ خوداو ژیان و گەردون و بەهەشت و دۆزەخ و قەزاو قەدەرو کارەساتی مردن، هەموو جارێ باسی مردن بکرایە لەلایدا دەستی دەکرد بە گریان لەگەڵ کەم تەمەنی و منداڵیەکەیدا، تا دایکی بەو گریانانەی زانیبوو بۆیە جوابی بۆ ناردو کاتێ هاتەوە پیێ ی ووت: کوڕم بۆچی دەگریت؟ عمر رضي الله عنه ووتی: بیرم لە مردن کردەوە، لەگەڵ بیستنی ووتەکەیدا دایکیشی دەستی کرد بەگریان.[١]

بەردەوام لەگەڵ قورئاندا ژیاوە و بیری لە ئایەتەکان کردۆتەوە و بە ووردی فەرمانەکانی جێبەجێ کردوە.

هەندێ لە هەڵوێستەکانی لە خزمەت قورئاندا:

أ - (ابن ابی ذیب) دەڵێت : هەندێ لەو کەسانەی لە خزمەت عمری کوڕی عبدالعزیزدا ژیاون بۆیان باس کردووم کە کاتێ ئەمیری شاری مەدینە بووە، پیاوێك لەلایدا قورئانی خوێندوە و گەیشتۆتە ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَآ أُلۡقُوا۟ مِنۡهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوۡا۟ هُنَالِكَ ثُبُورًا﴾ الفرقان: ١٣، واتە: (کاتێ ئەو کەسانەی ئەم قورئانەیان بەدرۆ خستەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دەخرێنە ناو زیندانێکی زۆر تەسکەوە لەناو ئاگردا دەست و ملیان پێکەوە کۆت کراوە،لەوکاتەدا هاوار ئەکەن و دوعا لە خۆیان دەکەن وا سەرپێچی خوای گەورەیان کرد لە دنیا ...)

لەو کاتەدا عمر رحمه الله دەست دەکات بە گریان و هاوار و بۆڕەی بەرز دەبێتەوەو، لە شوێنەکەی خۆی هەڵدەستێت و دەڕواتەوە بۆ ماڵ و خەڵکەکەش بڵاوەی لێ دەکەن.[٢]

---

١ـ البداية والنهاية (١٢/٦٧٨).

٢ـ الرقة والبكاء لابن ابی دنیا ژ٨٣

ب ـ (ابی مودود) دەڵێت: پێم گەیشتووە كە عمری كوڕی عبدالزیز ڕۆژێكیان ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا﴾ یونس: ٦١، دەستی كرد بە گریانێكی بە كوڵ تا هەمووماڵەوە گوێیان لە گریانەكەی بوو، فاطمەی بۆ لای و ئەویش بەگریانەكەی ئەو دەستی كرد بە گریان و دواتر هەموو خەڵكی ماڵەكە دەستیان كرد بەگریان، (عبدالملك) یش هات و دەبینێ هەموو دەگرین، بۆیە ووتی: باوكە گیان بۆچی دەگریت ؟ عمرﷺ ووتی: خێرە كوڕی خۆم، باوكت ئاواتە خواز بوو ئەو دنیای بناسیایە و نە دنیایش ئەوی بناسیایە، وەڵڵاهی كوڕی خۆم زۆر ترسام خوای گەورە لەناوم بەرێت، وەڵڵاهی كوڕی خۆم زۆریش ترسام یەكێك بم لە خەڵكی ئاگری دۆزەخ.[١]

مانای ئەو ئایەتەی سەرەوەش ئەویە: خوای ـ عزوجل ـ پێغەبەرەكەی ئاگادار دەكاتەوە، كە لەهەموو هەڵس و كەوتێكی ئەو و ئوممەتەكەی و هەموو دروستكراوەكانی و لەهەموو ساتێكدا ئاگادارە، ئەوەندەی قورسایی ئەتۆمێكی لێ وون نابێت لەنێو ئاسمانەكان و زەویداو لەشوێنی تایبەتیدا هەمووی تۆمار كردووە.

ج ـ لە (عبدالاعلی) ی كوڕی (عبدالله العنزی) وە دەگێڕنەوە دەڵێت : عمری كوڕی عبدالعزیزم بینی لەكاتی جومعەدا بوو دەستێ جلی لەبەردابوو كاڵ بوو بوویەوە و لە دوایشیەوە پیاوێكی حەبەشی دەڕۆیشت و كاتێ گەیشتە خەڵكەكە پیاوەكە لە جێی خۆی دانیشت و عمریش كە لە ریزەكاندا دەگەیشتە دووكەس پێی دەووتن : كەمێ مەجالم بدەن ڕەحمەتتان لێبێت، تا گەیشتە مینبەرەكەی، ووتارێكی دا و ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ( اذا الشمس كورت) ووتی : خۆر ئیشی چی یە؟! ﴿وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ﴾، تا گەیشتە﴿وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ﴿١٢﴾ وَإِذَا الْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ﴾ التكویر: ١٢ـ١٣. دەستی كرد بە گریان و هەموو نوێژ كەرانیش لە

---

١ـ الرقة والبكاء لابن ابي دنيا ژ٩١.

مزگەوتەکەدا دەستیان کرد بە گریان و مزگەوتەکە لە گریاندا دەزرنگایەوە وەك بڵێی دیوارەکانیشی دەگریا لەگەڵ گریانی خەڵکەکەدا.[1]

د- لە مەیمون ی کوڕی مەهرانەوە دەگێڕنەوە دەڵێت : عمری کوڕی عبدالعزیز سورەتی ﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ ۝١ حَتَّىٰ زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ﴾ دەخوێند، دەستی کرد بە گریان ووتی: بەڕاستی من وانازانم گۆڕستان بێجگە لەسەردان هیچی تر نیێە، پێویستە هەموو کەسێ ئەو سەردانە بکات و پاشان لەوێوە یان بۆ بەهەشت دەگەڕێتەوە یان بۆ ئاگری دۆزەخ.[2]

### ٣- واقیعی کۆمەڵگەکەی:

دەوروبەر زۆر گرنگ و کاریگەرە و ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە دروست کردنی پیاوانیمەزن و دروست بوونی کەسایەتیان، عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله لەسەردەم و دەوروبەرێکدا ژیاو ە کە تەقوا و لە خواترسان و چاکە کاری و هەوڵی فێر بوونی زانست و کردەوە کردن بە قورئان و سوننەت باڵی کێشابوو بەسەر خەڵکەکەیدا.

کۆمەڵێك لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو شارەدا دەژیان و لە عبدالله کوڕی جعفر و سائیب ی کوڕی یەزید و سەهلی کوڕی سەعدەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوەو لە سەهلەوە جامۆلکەیەکی پێشکەش کراوە کە کاتی خۆی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی تێدا خواردۆتەوە، بەر نوێژی بۆ ئەنەسی کوڕی مالك کردووە و لەو بارەیەوە ئەنەس دەڵێت : تا ئێستا کەسم نەدیوە وەك ئەم گەنجە بەر نوێژیەکەی لە پێغەمبەری خوا بکات[3].

ژیان لە کەس و هوایەکی ئیمانی وەك شاری مەدینە، بێگومان کاریگەری دەروونی و واتای مەزنی ئیمانی هەیە، ڕۆح تیایدا پەیوەستە بە خوداوە، (و ئێستاش برا حاجیەکانمان کە دێنەوە شتی زۆر سەر سوڕهێنەی لەو شارە مەزنە

---

١- دموع القراء لا١١١-١١٢.

٢- الرقة والبكاء ابن ابي دنيا ژ ٤.

٣- سير اعلام النبلاء (١١٤/٥).

دەگێڕنەوە لە حەوانەوەی دەروونی و بەرزبوونەوەی ئاستی باوەڕ و موسڵمانەتی و بچوك بوونەوەی دنیا و جوانیەکان و لەناو دڵی موسڵماندا کە سەردانی مەدینە دەکات دەی خوای گەورە بۆمان ئاسان بکات سەردانی ئەو جێگا پیرۆزە بکەین و شەحنێکی باوەڕەکەمان بکەینەوە امین)[1]

## ٤ـ قوتابی بەردەستی گەورە زانایانی ناو شاری مەدینە بوو:

عبدالعزیز ـ صالح ی کوڕی کیسان ی هەڵبژارد بۆ ئەوەی عمری کوڕی پەروەردە بکات، صالح دەستی کرد بە پەروەردە کردنی و هەموو نوێژەکان لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ نوێژی ـ جەماعەت ـ لە مزکەوت.

ڕۆژێك عمر‌رحمه الله لە نوێژێك دوا دەکەوێت لە مزگەوت و صالح پێی دەڵێت : چی دوای خستیت ؟ عمر ووتی : قژ چاك کەرەکەم خەریکی قژم بوو بۆی دادەهێنام. ئەویش پێ ی ووت: گەیشتووتیتە ئاستێك قژ داهێنانەکەت پێ خۆشتر بوو لە نوێژی بە کۆمەڵ.؟!

نامەی نارد بۆ عبدالعزیزی باوکی و ئاگاداری کرد و ئەویش کەسێکی نارد بۆی بێدەنگ سەری بۆ سفر کرد.[2]

عمر هەر لەو سەردەمەوە بیری کردەوە و پاشان وای لێهات زۆر سووربوو لەسەر نوێژەکانی و ئەوپەڕی هەوڵی دەدا لە نوێژی پێغەمبەری خواﷺ بچێت، وای لێهاتبوو کرنووش و سوژدەکانی بەلەسەر خۆ ئەنجام دەدا هەستان و دانیشتنەکانی کورت دەکردەوە و لە ڕیوایەتی صەحیحدا هاتووە: کە لە رکوع و سوجدەدا(١٠) جار سبحان الله العظیم و سبحان الله وبحمده.[3]

کاتێ باوکی لە حەج گەڕایەوە و لە مەدینە لایداو سەردانی عمری کوڕی کردو دەربارەی هەڵس و کەوتی عمر . لێی پرسی، ئەویش لە وەڵامدا پێی ووت : گومان

---

١ـ ووتەی وەرگێر .
٢ـ البدایة والنهایة (١٢/٦٧٨).
٣ـ هەمان سەرچاوە لا (١٢/٦٨٢).

نابەم کەس هەبێت ئەوەندەی ئەم کوڕە لاوە خوای گەورە لە دڵیدا گەورە بێت.[١]

یەکێکی تر لە مامۆستاکانی عمر رحمه الله، کە زۆر کاری تێکردبوو، عبیداللە ی کوڕی (عبداللە) ی کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود، عمر رحمه الله زۆر ڕێزی لێ دەگرت، لە زانیاریەکەی بەهرەمەند بوو، بەڕەوشتە بەرزەکەی ڕەوشت بەرز بوو، بەردەوام سەردانی دەکرد تەنانەت پاش ئەوەیشی کە بوو بە ئەمیری شاری مەدینە، عمر رضي الله عنه سەرسامی خۆیی بۆ ئەو مامۆستایەی دەردەبڕێت و دەڵێت : (بەشداری کردنی یەکێ لەوانەکانی ئەم نابینایە ـ مەبەستی عبیداللە ی کوڕی عبداللە بوو ـ لە هەزار دینار زیاتر پێم خۆشە).[٢]

لەبەر ئەو زانیاری و زیرەکی یەی مامۆستاکەی (عبیداللە)، لەسەردەمی خەلافەتی خۆیدا دەڵێت : ئەگەر ئێستا عبیداللە زیندوبوایە لە ڕاووبۆچوونەکانی لام نەدەدا، ئاواتم ئەوە بوو یەك ڕۆژی عبیداللە م ببوایە نەمدەدا بە ئەوەندە و ئەوەندە.[٣] ئەم (عبیداللە) یە موفتی شاری مەدینە بووە، یەکێ لە حەوت زانا گەورەکە بوو.[٤] و (الزهری) دەربارەی ئەو زانایە دەڵێت : (عبیداللە) ی کوڕی (عبداللە) دەریایەك بوو لە دەریاکانی زانست[٥].

دەستی شیعر نوسینیشی هەبووە و ئەم چەند دێرەی بۆ عمر ناردووە:

باسم الذی انزلت من عنده السور والحمدلله اما بعد یاعمـــر
ان کنت تعلم ما کنت وما تـذر فکن علی حذر قد ینفع الحذر
واصبر علی القدر المحتوم وارض به الا سیتبع یوما صفوه الکـدر[٦]

---

١ـ هەمان سەرچاوە لا (١٢/٦٧٨).
٢ـ عمر بن عبدالعزیز — عبدالستار الشیخ لا٥٩. تهذیب التهذیب (٧/٤٧٧)
٣ـ عمر بن عبدالعزیز — عبدالستار الشیخ لا٥٩.
٤ـ سیر اعلام النبلاء (٤/٤٧٥).
٥ـ هەمان سەرچاوە لا (٤/٤٧٧).
٦ـ هەمان سەرچاوە لا (٤/٤٧٧).

ئەم زانایە لە ساڵی ٩٨ ی کوچیدا لە دنیا دەرچووە و هەندێك دەڵێن ٩٩.[١]

یەکی تر لە مامۆستاکانی عمر -(سەعیدی کوڕی موسییب) ە و ئەم زانایە هەرگیز سەردانی هیچ کار بەدەست و ئەمیرێکی نەکردووە جگە لە- عمری کوڕی عبدالعزیز-[٢]

یەکێکی تر لە مامۆستاکانی - سالم ی کوڕی عبداللە ی کوڕی عمری کوڕی خطاب - ئەو پیاوە بەرزەی کە سەعیدی کوڕی موسەییب دەربارەی دەڵێت :عبداللە ی کوڕی عمر لە هەموو کوڕەکانی زیاتر لە عمری دەکرد و سالمی کوڕی عبداللە یش لە هەموو کوڕەکانی عبداللە زیاتر لە عبداللە دەچوو[٣]، (ابن عمر) زۆر زۆر سالم ی کوڕی خۆش ویستووە.

ئیمام مالیك دەڵێت: (لە سەردەمی سالم دا هیچ کەسێك لەو زیاتر لە پیاو چاك و صالحین ی پێش خۆی نەچووە لە دنیا نەویستی و خێر و مەندی و ژیاندا، بەدوو دەرهەم دەستیَ جل و بەرگی دەکڕی،وکاتیَ (سلیمان)ی کوڕی (عبدالملك) بینی وا جوان و پیَکەوتەیە لیَی پرسی: ئەوە چی دەخۆیت؟ ووتی: نان و ڕۆن، ئەگەر گۆشتیشم دەست بکەویَ دەیخۆم، لەوێدا عمر لیَی پرسی: ئەی حەزی لیَ دەکەیت؟ سالم ووتی: ئەگەر حەزی لیَ نەکەم ماوەیەك نایخۆم تا حەزی لیَ دەکەمەوە.[٤]

ڕۆژێکیان سالم بە جل و بەرگی ناشیرین و ئەستوورەوە دەچێتە لای (سلیمان)ی کوڕی (عبدالملك) سلیمانیش بەگەرمی پێشوازی لیَ دەکات و ئەوەندە لە خۆی نزیکی دەکاتەوە تا لەپالَ خۆیدا دایدەنیشێنیَ و لەو کاتەدا عمری کوڕی عبدالعزیزیش لەو کۆڕەدا دەبێت، پیاوێك بە سووکی بە عمری ووت : ئەوە خاڵت نەیدەتوانی جل و بەرگێکی لەمە جوانتر لەبەر بکات و بێتە خزمەت ئەمیری باوەڕداران ؟ئەو پیاوە خۆی جل و بەرگێکی زۆر جوان و گرانبەهای لەبەردابوو- و

---

١- هەمان سەرچاوە لا (٤/٤٧٨-٤٧٩).

٢- الجوانب التربوية فی حياة الخليفة عمر لا٢٥.

٣- سير اعلام النبلاء (٤/٤٥٩).

٤- هەمان سەرچاوە لا (٤/٤٦٠).

